# زریموك

گوڤارەکا هەیڤانەیا بچویکایە دەزگەهێ هەرمان ل دەڤەرا بارزان دەردکەت

## پەیڤا بەرایێ :

زاروکێت دەلال ئەزمونێ ژیانا کەسێت سەرکەفتی بو مە خۆیا دکەت کو هەبوینا ئامانجان د ژیانێدا یا گرنگە و کارتێکەری هەیە لسەر سەرکەفتنا مروڤان. لەورا فەرە هەرگاڤ و دهەمی قوناغێت ژیانێدا مروڤ خۆدان ئامانجێت دیاریکری بیت.
ئەو زاروکێت ل دەستپێکا ژیانێ پێخەمەت ئامانجێت خویێت دیاریکری دخەبتن بێگۆمان دێ گەهنێ . ژ بیر نەکەن کو دەمپێشا هنگو , ڤەرێژا هزر و بوچون و جورێ ئامانجێت هنگویە.لەورا فەرە گەلەك ب هیڤی و هێزڤە بەرێ خو بکەنە دەمپێشێ بوگەیشتن ب ئامانجێت خو.

خاوەن ئیمتیاز و سەرپەرشتیار: فاخر علی عارف 07504479822
سەرنوسەر: مبەشەر حسن حدو 07504499639
بەرێوەبەرێ نوسین و گرافیست:حسێن حسن ئەحمەد 07504495908
سەرپەرشتیاری هونەری و گرافیك : هوگر سدیق 07504479951
سەرپەرشتی چاپ : سەبیح عزەت 07504614343
ئەرشیڤ وتایپ: شیلان رەشید شێرو
سەرپەرشتی دابەشکردن : زکری پیرو 07504559273

دەستەی نوسەران :
حازم محمد بلەیی
ئاسیا حسێن هەمدلی
فازل شریف

ناڤ ونیشان :
کۆردستان . بارزان . باژێرکێ بلێ. دەزگەهێ هەرمان
Email:zreemok@yahoo..com

# هێستر

هۆزان : حازم سافیا بلەیی
نیگار: حسێن حەسەن



هێستر ژی گیاندارە
بۆکارکرنێ بکارە

هەبوونا وێ مفایە
فایدێ هەمی خەلکایە

نوکەنە, هەجا پێشا
ئاڤ بۆخەلکی ڤەد کێشا

جەنجەر و جوت پێدکرن
تشت پێ دئینا و برن

ل جیاتی ملێ دارا
دال هێسترێ کەن بارا

بۆ کارێت مەزن و پێدڤی
دا ل هێسترێ کەن هیڤی

گەر ئەڤرو بەراورد کەن
پیکەب هندی وێ ناکەن



# هانسێل و گریتێل

ئا :حسێن حه سه‌ن
نیگار:حسێن حه‌سه‌ن

رۆژێك له‌ رۆژان ، داربڕێكی هه‌ژار هه‌بوو، دوو منالیان هه‌بوو، زۆر منالْ بوون كه‌ دایكیان مرد.داربڕه‌كه‌ ژنێكی‌تری هێنا .ئێواره‌یه‌كیان ، دوو مناله‌كه‌ زۆریان برسی بوو، به‌لام هیچیان نه‌بوو بیخۆن ، ناچار هه‌ولیان دا بنون.گوێیان لێبوو باوكیان و باوه‌ژنه‌كه‌یان له‌ ژووره‌كه‌ی ئه‌ودیو قسه‌یان ده‌كرد .باوه‌ژنه‌كه‌یان وتی: ناتوانین خۆراكی خۆشمان بۆ ئه‌و دوو مناله‌ش په‌یدا بكه‌ین ئه‌گه‌ر وا بڕوات هه‌مووومان به‌ برسێتی ده‌مێنینه‌وه. سبه‌ینێ بیانبه‌ بۆ دارستانه‌كه‌ و به‌ جێیان بهێله. داربڕه‌كه‌ رازی نه‌بوو، به‌لام نه‌شیده‌ویست هاوسه‌ره‌كه‌ی له‌ ده‌ست بچێت بۆیه‌ سه‌ره‌نجام دوای مشتومڕێكی زۆر رازی بوو. دوو مناله‌كه‌ زۆر ترسان ، به‌لام هانسێل به‌ خوشكه‌كه‌ی وت خه‌مت نه‌بێت ، سبه‌ینێ به‌ درێژایی رێگا ورده‌ نان ده‌ڕێژم بۆئه‌وه‌ی رێگه‌ی ماله‌وه‌مان لێ بزر نه‌بێت . بۆ سبه‌ینێ باوكیان هه‌ردوكیانی برد بۆ دارستانه‌كه‌ و هانسێلیش به‌ دزییه‌وه‌ ورده‌نانی رۆ ده‌كرد به‌لام دوای ئه‌وه‌ی باوكیان جێی هێشتن و ویستیان بگه‌ڕێنه‌وه‌ ، ورده‌ نانه‌كه‌ دیار نه‌ما بوو له‌ به‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ بالنده‌كان هه‌موویان خوارد بوو، ئیتر هه‌ردوكیان به‌ برسێتی و به‌ ترسه‌وه‌ به‌ ناو داره‌كاندا كه‌وتنه‌ گه‌ران به‌لكو رێگاكه‌ بدۆزنه‌وه‌ .له‌ پڕێكا چاویان به‌ خانوویه‌ك كه‌وت كه‌ له‌كێك و شیرینی دروستكرا بوو، به‌ په‌له‌ به‌ره‌و ماله‌كه‌ رۆیشتن و ده‌ستیان كرد به‌ خواردنی دیواره‌كانی .له‌ پڕێكا ده‌نگێكی ناخۆش هاواری كرد:ئه‌وه‌ چی ده‌كه‌ن ؟







ئەوە دەنگی پیرێژنێکی جادوگەر بوو , کە حەزی لە گرتن و ئا زار دانی منالان بوو. لە پێشا جادوگەرەکە خۆی وا پیشاندا کە ژنێکی باشە , بەلاّم بۆ رۆژی دوایی هانسێلی لەناو ژورێکدا زیندانیکرد و گریتلیشی ناچار کرد بەردەوام خواردن دروست بکات و دەرخواردی هانسێلی بدات. بە پێکەنینێکەوە وتی: "ئیتر قەلەو دەبێت و خواردنی خۆش دەخوات." دواجار رۆژێکیان ژنە ئەفسونبازەکە لەوە زیاتر خۆی بۆ رانەگیراو بڕیاری دا هانسێل بخوات. بە گریتێلی وت ئاگرێکی گەورە لە ژێر فرنەکەدا بکاتەوە . پێی وت: سەرت ببەرە ناو فرنەکەوە بۆ ئەوەی بزانیت جوان گەرم بووە. بەلاّم گریتێل خۆی وا پیشان دا کە تێنەگەیشتووە, بۆیە جادوگەرەکە بە تورەیی پالی پێوەنا . کچەکە دەرفەتی هێناو پالێکی قایمی نا بە جادوگەرەکە وە , خستیە ناو فڕنەکە و دەرگاکەی بە قایمی داخست.



گریتێل وای زانی براکەی لە ناو فڕنەکەدایە , یەکسەر ڕای کرد بو ئەوەی ڕزگاری بکات.زۆری پێخۆش بوو کە براکەی هیچی لێنەهاتووە.بەلاّم براکەی شتێکی بیر کەوتەوە و وتی:"بەلاّم ئێمە هێشتا رێگای مالەوە نازانین" . لەو کاتەوە مەلێك لە ئاسمانەوە هات و پێی وتن:من ڕێگای مالەوەتان نیشان دەدەم , چونکە کاتی خۆی من نانە وردەکەم خوارد و ئێستا مافەکەتان بۆ دەگێڕمەوە . ئیتر مەلەکە بە نزمی و هێواشی فری و ئەوانیش دوای کەوتن .دوای ماوەیەك گەیشتنە مالّەوە , باوکیان کە چاوی پێیان کەوت ,لە خۆشیدا دەستی کرد بە گریان . منالەکان وتیان مژدەیەکی خۆشیشمان پێیە , دەستیان کرد بە گیرفانیاندا , ئەو هەموو زێڕ و زیوەیان دەرهێنا کە لە مالی جادوگەرەکە کۆیان کرد بۆوە , ئینجا وتیان : جارێکی تر هەرگیز هەژار نابین.





# سووسك (سویسکە)

AMMOPERDIX GRISEOGULARIS

(23-25)سم درێژە ,بالندەیەکێ خوجهیە.یێ نێر سەرێ وی ڕساسییەکێ باڤسۆرە و سەر گوهکێت وی سپینە ئەنیا وی ڕەشە و ژ ئەنییێ گیخەکا ڕەش دەست پێ دکت دسەر چاڤانرا دچیت و ڤەدەرەکێ دبۆریت ,وەکی ژ سەریڤە ڤەهواییەکێ ب سەر ئەسمەریڤەیە هندەك گیخێت پێتی پێتی لێنە.ئەرزینك و حەڤك ڕساسییەکێ ب سەر شینیڤەیە, سینگ گەورەکێ ب سەر سۆریڤەیە ,زك ڕساسییەکێ سپیتالەیە ب قەهواییەکێ پێتیتامدایە ,تەنشتێت وی گیخدارن ب گیخێت ڕەش و سپی و قەهواییەکێ پێتی. یا مێ گیخا ڕەش د سەر چاڤانرا نینە و ئەرزینك و بن حەفکا وێ سپییە،بارا پتر قەهواییە. گیخێت قەهواییێت باڤسۆر لێنە,سینگ و زك و تەنشت ژ پشتێ ڤەکریترن و گیخێت زراڤ لێنە. سپیلکا چاڤان قەهواییە نکل و پێ زەریڤەنە و ل ناڤ چیایان و ل دەڤەرێت ب زوور و چیا دێمك و نهال مشەیە و چ جا ناهێتە دەشتان .خودکەتە ڕەڤێت بچووك بەلێ دەمێ هێلین چێکرنێ و تێژك(جویچك) ئینانە دەرێ جۆتك جۆتك بەلاڤ دبیت.بارا پتر سپێدەیێ و بەری ڕۆژئاڤا بوینێ دهێتە دیتن و نیڤرۆییان قەوی ناهێتە دیتن .ژ نیڤە هەیڤا شەش پێدە تێژکان دئینیتە دەرێ یا مێ ژ 13-7 هێکان دکەت و کورك بوینا وێ 21 ڕۆژن .خوارنا وی گل و گیا و دان و کێز و مێز و کرموکن ل تورکیا و عێراقێ و ئیرانێ هەتا دەڤەرا دەریایا قەزوین و ئەفغانستانێ و ترکستانێ و ژۆرییا ڕۆژئاڤایا هندێ تێژکان د ئینیتە دەرێ.





ئـــا/ زریموك
ژێدەر/بالندەیێن کوردستانێ پشکا ئێکێ







# خەیریا مستەفا حەمە

## خەیریا وەکی هوزانڤانەکا بەهرەمەند....

ئا:حسێن حسن ئەحمەد

بو ڤێ جارێ ئەم دێ د گەل هەڤالەکا خوشتڤی و زیرەك هەڤدیتنێ کەین کو بەهرەیا گوتنا هوزانان یا هەی , ناڤێ هەڤالا مە و هنگو (خەیریا مستەفا حەمە) کو ل دایك بوویا 5/20/ 1996 و ئاکنجیا مەزنێ یە کو دکەڤیتە رەخێ مێرگەسوورێ, خەیریا پولا دووەمێ ناڤنجییە و گەلەکیش یا زیرەکە ل قوتابخانێ ,خەیریایێ هەتا نوکە چەندین هوزان ب زمانێ شرینێ کوردی و زمانێ ئێنگلێزی گوتینە و یا بەردەوامیشە , و هوزانێت خوو بو گوڤارا زریموك و بەرنامەیا زریموك ل رادیویا هەرمان ل دەڤەرا بارزان هناردینە و ب کار هاتینە, خەیریا دکاریت ل سەر هەمی بابەتان هوزانان ببێژیت بەلێ پا زێدەتر حەز و ئارەزوویا وێ سروشتێ کوردستانێیە ,ئەو حەز دکەت ل پاشەرۆژێ ببیتە دەرهێنەرەکا ب شیان بو بەرهەم ئینان و دەرهێنانا دراما و فیلمێت سینەمایی و ڤیدیو کلیپان . هەڤالا مە د بێژیت من دڤێت دەمێ ئەز بویمە دەرهێنەر من پێخوشە و دێ هەول دەم ل سەر دیروك و کومەلگەهێ کوردەواری فیلمان دروست کەم . ئەڤەش نموونەیەك ل هوزانێت خەیریایێ کو ل سەر وەرزێت سالێ گوتییە:

| | |
|---|---|
| **من سالم و رەنگاورەنگم** | **چار وەرز و دوازدە مـانگم** |
| **من بەهارم بەهارم** | **بێ خـەم و پر لە گـوڵزارم** |
| **من هاڤینم هاڤینم** | **گـەرمای مێوەی شیرینم** |
| **من پائیزم پائیزم** | **زوور بـە رەنگ و ئـازیزم** |
| **من زستانم زستانم** | **سەرمـای بەرف و بـارانم** |
| **هەر چواریان پێکەوە جوانن** | **بـو بـەردەوامی ژیـانن** |
| **روژ و مانگ و سال** | **هیوادارم هەر جەژن بێ بو منال** |

هیڤیا سەرکەفتنێ بو هەڤالا خوو دخازین وهیڤیدارین ببیتە نموونەیەك بو زاروکێت کوردستانێ.



# MAMÈ NEWROZ



ئا:م . رەشید

زاروکێت خوشتڤی ئەو بەرسڤێت مە ب رێنڤیسا لاتینی ل هەمبەر پرسیاران نڤیسی، هنگ پێدوەستن دناڤ خشتەیا لاپــەرا بەرامبەردا ڤەبینن ʹو نیشاندار بکەن ، ل دویماهیێ هندەك پیت دمینن کو ناڤێ گوڤارەکا زاروکایەوʹ رێکەفتا 18/3/2010 شەش سال تێپەر بوین ل بەلاڤـ بوینا وێ .



1/کیژ ئاڤ زویتر دبیتە سەهۆل . ئاڤا سویر یان یا شیرین؟

**Ava şirîn**






2/دبێژنە چ تشتی زێرێ رەش؟

**Neft**




3/ کورتترین هەیڤـ د سالا زایینی دا ؟

**şûbat**





4/بالندەکێ کەیی‌یە کو هێلکا وێ (24) جاران بچوکترە ژیا نەعامێ( حێشتر مریشك)؟

**Mirîşk**



5/کیژ ئاژەلʹ د ژیانێدا چاڤێت خۆ نانقینیت؟

**Mar**





6/لەزاتیا وێ 300/000 کیلومەترە د چرکێدا ؟

**Rûnahî**



7/ ل سالا 1952 هاتیە ئافراندن و زور ب کار دهێت ؟

**Maykrûfon**

8/بەها ئەدین کورێ شێخ شەمسەدین میرنشینەك دامەزراند . ناڤێ وێ میرنشینێ چ بوی؟

**Badînan**





zarokêt hêja di zîrek bin û bersivêt ko li lapera çuyî da hatî di vê xiştê da vebînin u bi pênusî nîşandar biken.

| | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| د | ه | م | * | ن | ی | ر | ش | ا | ڤ | ا | ئ |
| ت | ف | ه | ن | * | ا | م | و | ك | ا | ب | ك |
| م | س | ه | م | ه | ح | * | ت | ا | ب | و | ش |
| * | ك | ش | ی | ر | م | * | ی | ج | ر | و | ت |
| ب | ن | ا | ك | * | ر | ا | م | * | ر | و | ج |
| خ | م | ا | ن | ا | * | ی | ه | ا | ن | و | ر |
| ن | ۆ | ف | و | ر | ك | ی | ا | م | * | ا | ه |
| ه | ێ | ب | ه | * | ن | ا | ن | ی | د | ا | ب |
| * | ر | گ | و | ه | * | ك | و | م | ی | ر | ز |






# هەر جار و ناڤدارەک

زاروکێت خوشتڤی مامێ نەوروز بو ڤێ هژمارێ ل برگا تایبەت ب ناڤداران دێ هوزانڤان (محمد صالح دیلان 1927-1990) دەتە ناساندن. هۆزانڤان (محمد صالح دیلان ) کورێ مەلا ئەحمەدە ,و ل گەرەکا گوێژە ل باژێرێ سلێمانیێ ل هەمبێزا مالباتەکا ئەدەب دوست و هونەرا کوردی ل سالا 1927 زایینی ژ دایکبویە. د سالێت چلا یێت چەرخێ بیستێ ئێك بویە ژ ئالیگرێت بزاڤا نیشتیمانی یا کوردی و ل دەمێ ب رێڤەبرنا چالاکییێت سیاسی‌دا هەڤرویشی گرتنێ هاتیە و هاتە دویر ئێخستن ل سالێت 1947-1966 و زۆرترین ماوێ گرتنا خول گرتیخانێت (کۆت-بەغدا-نوگرە سەلمان) بریە سەری. دیلانێ هۆزانڤان هەر ل دەستپێکا ژیانا خودا حەز ژ سەر هاتییێت هۆزانڤانێت کەڤن کریە وەکی (سالم-مەولەوی- مەحوی و...هتد) و هەر دیسان هۆزانڤانێت نوی وەکی پیرەمێرد و گوران. دیلان یێ زیرەك بوی دەمێ د چوویە ناڤ جیهانا داستان و ئەفسانەیێت کوردیدا و هەروەتۆڤ یێت جیهانێش. هەژی گۆتنێیە کو نە تنێ دیلانێ هۆزانڤان ,هۆزان چێکرینە بەلکی سترانیش گوتینە .ژ گرنگترین بەرهەمێت وی: *دیوانی شەر و ئاشتی * دیوانی کوندەبەبوی شەر* دیوانی شێخ مەحمودی زیندوو* دیوانا دیلانا * دیوانی پاییزی جارانٚ * دیوانی شیعری. و ل 28 تشرینا دووێ سالا 1990 و ل ژیێ شێست و شەش سالیێ چویە بەردلوڤانیا خودێ مەزن.

# مویری و زرکیت (زەرونک)

و:سونیتا هەمدلی
نیگار:حسێن حەسەن



ڕوژەکێ زرکێتەك و موێرییەك گەهشتنە ئێك , زرکێتێ موێری دیت کو زور ب تالیڤە یا دانی دبەت بو هێلینا خو و یا بو زستانێ خارنێ خرڤە دکەت . دەمێ کو زرکێتێ موێری ب ڤی ڕەنگەی دیتی گوتێ: هەرێ موێری تو بو چی هێتوڤە خو ماندی دکەی؟ وەرە وەکی من هەرجهێ دلێ تە لێ هەرێ و خارنێ بخو , ئو چ جارا د هزرا سبەیدا نەبە , وەکی من هەردەمێ دلێ من هاتێ ل هەر جیێ بیت دێ چم خارنا خو خوم , زرکێتێ پشتی ڤان گوتنا گوتێ بەرێ خو بکەرە من نوکە دێ چمە ڤێ دوکانا گوشت فروشی دێ تێری خوم. موێرییێ ب هویری چاڤدێریا وێ دکر.





زرکێتیێ هەولدا کو بچیت ل سەر هێستکەکێ بنویشیێت و تێر گوشتی بخوت لێ ژ نشکێڤە تویشی تورەکا ب چرك بوی و ب تەلیێ دا کەفت . هندی بزاڤکرن و پێکول کرنەکاری خو ژ وێ داڤێ رزگار بکەت ژبەر کو ئەو چرك زور یا ب هێزبوی , ب نەچاری کرە هەوار و داخازا هاریکاریێ ژ موێریێ کر , موێری هێدی هاتە پێش و گوتێ هەڤالا خوشتڤی مەزنا یێ گوتی (( دەستێ ب کێر , دانێ سەر زکێ تێر ))
زرکێتیێ گوت: تو راست دبێژی و ئەز یا شاش بویم , سوز بیت ئەگەر من ڤێ جارێ رزگار بکەی ئەزیش دێ وەکی تە ب تنێ پشت ب کەد و بەرهەمێ دەستێ خوڤە گرێدەم . موێریێ پێ زرکێتیێ گرت و ب هەمی هێزا خو راکێشا و زرکێت رزگار کر.



هۆزان

# باغچەکەم

ن: مسلم دۆلەمەری
نیگار: حسێن حسن



باغچەی ماڵم چەند جوانە   پڕلە گوڵ و ڕیحانە
دار و درەختێکی جوان   نای گۆڕم بە گشت جیهان
چونکە ئەوان جوانن   خاوەن جۆری گوڵانن
بۆیە من ئاویان دەدەم   پاك و خاوێنیان دەکەم
ئێوەش ئەی هاوڕێکانم   منال و چاوگەشانم
باغچەکانتان ئاو بدەن   گشت کاتێ خاوێن بکەن



بێخاڵ مهدی محمد





محەمەد معتصم(1 ساڵ)

جەژنا ل دایکبوینا هنگو پیروز بیت.



# ل بەر بانکێ پیرێ

ئا.م.رەشید

## وارێ مە

زاروکێت خوشتڤی ژبو کو هنگو پێزانین ل سەر باژێر و باژێروك و گووند و ئاڤا هی یێت ولاتێ خۆ هەبن بو ڤێ جارێ دێ باژێروکێ ((ئاکرێ))بۆ هنگو دەینە ناسین.

* ئاکرێ قەزایەکە ل کوردستانا باشوور ل پارێزگەها (دهوك) سەنتەرێ کارگێڕیا وێیە سنوورێ وێ یا کارگێڕی ل باکوور قەزایا ئامێدیێ و ل باشوور دا پارێزگەها هەولێر و نەینەوایە واتە ئەربیل و موصل و ل رۆژ هەلاتێدا پارێزگەها هەولێر و ل رۆژئاڤا قەزا ئامێدی و پارێزگەها نەینەوا.

رووبەر:2829 کیلومەترا چوار گوشە ل سالا 1987 زایینی دا.

هژمارا روینشتڤانێت وێ: 92977 کەس.

مێژوویا کارگێڕی :ل سالێت سیهان بوویە قەزا.

ل گور پەیمان نامەیا 11 ی ئادارێ ل سالا 1970 دنێڤبەرا شورەشا کورد و حکومەتا عیراقێدا هاتیە سەر کارگێڕیا پارێزگەها دهوك .



## گوتنێت مەزنان



ئەز چیا و تو چیا ,گولك ما بێ گیا

## مەتەل



قازانا دانە کوتایێ برە بەغدایێ دەنك لێ نەرژیایێ.



# گەشتەك ل ئەسمانێ بارزان

## هەمدلا



ئا:ئاسیا حسێن

رێکار:سەروین گیان گەشتا خویا ڤێ جارێ ببەینە کیرێ؟

سەروین :ڤێ جارێ دێ چینە گوندێ هەمدلا کو د کەڤیتە دویریا ٧ کیلومەتران ب لایێ روژئاڤایا باژێروکێ بارزان و ل بنارێ چیایێ شرینێ جێ گرتیە.

رێکار : ئەڤە ئەم چوین ,لێ هەتا دگەهینە هەمدلا هندەك پێزانینان بدە من لدور چاڤکانیێت ژیانێ و ئاڤەدانیێ.

سەروین: کشتوکال و خودان کرنا تەرش و تەوالی دوو ژێدەرێت گرنگێت ژین و ژیانا ئاکنجیێت ڤی گوندی بویە ل کەڤندا و هەر وەسا چەند کانیەکێت ئاڤێ یێت بناڤ و دەنگ لێنە،وەك(کانیا بچکێ-کانیا گوندی) کو دوو کانیێت سەرەکیێت ژیدەرێت کشتوکالینە و هەتا نوکەش خەلکێ گوندی مفای لێدبینن.

رێکار:ل رویێ کەڤناری و شوینواریڤە یێ چەوایە؟

سەروین:ژ لایێ شوینەوارێت کەڤناریشڤە ڤی گوندەی چەندین شکەفتێت دیروکی و کەڤنار و بناڤ و دەنگ لێ هەنە و ل وانا( شکەفتا بەردالەی -خلویێ- عەرەبا-هوین -سەرێدرێ-گارانێ) .

رێکار: ب وان نیشانێت تە دایە من دڤێت گوندێ هەنێ ئەوێ جادا گشتی پێدا دەرباز دبیت و د کەڤیتە دەڤ رویباری ,هەمدلا بیت؟













سەروین:بەلێ راستە ،زێدەباری کو چەندین جاران ئەڤ گوندە هاتیە وێرانکرن و سوتن لێ دچارچوڤێ ئاڤەدانکردنێ و گەشەپێدانێدا حکومەتا هەرێما کوردستانێ رولەکێ مەزن دیتیە د خزمەتکرنا ڤی گوندەی وەك چێکرنا مزگەفت و قوتابخانەیا بنەرەتی و بنگەهێ تەندروستی و لێدانا بیرا و راکێشانا ئاڤێ و کونکریت کرنا جوکێت ئاڤدانێ و دروستکرنا خانیوبەران و راکێشانا هێلا کەهرەبایا گشتی بۆ خەلکیو هەر وەها کارگەهەك بو چێکرنا چیپس و پفەکان ل ڤی گوندەی هەیە.

رێکار:چ وار و جهێت خوش ل ڤی گوندەی هەنە؟

سەروین: بەلێ ( سەرەزکا - کیژیێ- صومایێ - سەپاسارك ) ئەڤە چەند جهەکێت گرنگ و خوشن و د کەڤنە هنداڤا گوندی و سیمایەکێ جوان و رەنگین ددەتە گوندی و بۆ سەیران و گەشت و گوزاریێش ل بهارێ دا جهەکێ ئارام و خوشە.نوکەش ئەڤ گوندە ل (١٣٥) خێزانان پێك دهێت کو زێدەتر ل (٦٠٠) ئەندامان ل خو دگریت.

رێکار: پا ئەڤە من بالەفرنەڤی کر دا وێنان بگرین.

چرك.......چرك ...





# بەریکانێ BERÎKANÊ

ئا:حسێن حەسەن
حسێن ماهر

ئەو چ پێنج هەژمارەنە کە ل دویڤ ئێک دهێن و ئەنجامێ کویا وان ب گشتی دکەتە 100؟



## ئاسانکاری:

22+-----+20+----+18=100

زارۆکێت زیرەک بو مە بێژن کا چێوێ ئەڤ شێوەی چەندە؟




بەرسڤا بەریکانا زریموکا ژمارە 31 ئەڤەیە: ل جیاتی xدڤیا ژمارا 8 بیت.



# تێلەڤزیون و کزیا چاڤان

ن:ئاسیا حسێن هەمدلی
نیگار:حسێن حەسەن ئەحمەد

زیلان و زریان خویشك و برا بوین. زور کەیف ب بەرنامێت تێلەڤزیونێ دهات نەمازە فیلمێت کارتون و بەرنامێت زاروکان زور پێخوش بوین .دەمێ لبەر تێلەڤزیونێ دروینشتن , بێنا زریانی نەدهات هەتا کو نەچوبا دبن تێلەڤزیونێ را. هندی زیلانێ د گوتێ و شیرەتڤانیا وی دکر کو نزیکی تێلەڤزیونێ نەروینێت , لێ زریانی گوهداری نەدکر و خو ژ تێلەڤزیونێ دویر نەدکر. هێدی هێدی کار تێکەریا تێلەڤزیونێ لسەر چاڤێت زریانی خویا بوی و هێزا دیتنا وی کێم بوی و تویشی کزیا چاڤان بوی و هەست ب ئێشێ‌کر د چاڤێت خودا , روژا پاشتر ناچار بوی مولەتێ ژ قوتابخانێ وەرگریت بو سەردا نیکرنا پزیشکێ‌چاڤان. دەمێ پزیشکی چاڤێت وی پشکنی , گوتێ: چاڤێت تە یێت تویشی کزیێ بوی و دڤێت تو بەرچاڤکان بکار بینی و هندەك دەرمانێت تایبەت ژی بو نڤیسین و شیرەتڤانیا وی کر کو ئێدی چ جاران ل (3) مەتران نزیکتری تێلەڤزیونێ نەبیت و ماوەیەکێ زور بەرێ خو نەدەتە تێلەڤزیونێ .زریان ب دلگرانیڤە ل ژورا پزیشکی دەرکەفت و بەرەڤ دەرمانخانێ چو. پاشترل نەخوشخانێ دەرکەفت و سەردانا جهێ چێکرنا بەرچاڤکان کر. پشتی کو بەرچاڤکێت خو وەرگرتی و دانایە بەر چاڤێت خو هەر تشت رونتر و جوانتر ببوین , هنگی زانی کو چ زیانەکا گەهشتییە چاڤێت وی ,زوریش کەیفخوش بوی دەمێ کو بو سوپاسکرنا پزیشکی ڤەگەریای و گوهلێبوی کو رێژەیا لاوازیا چاڤێت وی ب تنی(0/05)ە و ئەگەر بێت و شیرەتێت پزیشکی جێبەجێ بکەت دێ چاڤێت وی چارەسەر بن ,لەورا سوزدا کو کێمتر بەرێ خو بدەتە تێلەڤزیونێ و چ جاران ژی ل نێزیك دانەنیشیت.









ئا:حسێن حەسەن ئەحمەد
سەرچاوە : بانکی زانیاری



# بۆچی مار کاژ دەخات؟







مار لە خشۆکە خوێن سارد و لاشە درێژەکانە. لە هەموو ناوچەکانی جیهانیشدا هەیە ، نزیکەی(2400)جۆر مار هەیە و هەموشیان کاژ فڕێ دەدەن. ئەم دیاردەیە بە هۆی ئەو تایبەتمەندیەوە ڕودەدات کە لە مار دا هەیە ، لە بەر ئەوەی مار بە بەردەوامی لاشەی گەورە دەبێت تەنانەت لە کاتی پیریشدا کە کاتێك مارەکە گەورە دەبێت کاژەکەی تەنگ دەبێتەوە .لە بەر ئەوە ناچارە لە بەری خۆی دایکەنێت. مار لە مانگێکەوە بۆ سێ مانگ جارێك بە گوێرەی جۆری مارەکە ,بە ڕێك و پێکی کاژەکە فڕێ دەدات ، بە لێخشاندنی پێستەکەی بە شتێکی زبر. ماران لە ڕوی بایولۆژیەوە, پەیوەندیان بە بڕبڕەدارە خوێن ساردەکانەوە هەیە. وەك بزنمژەك و تیمساحی ئەمریکی و کوێسەلە.





ئا :حسێن حەسەن ئەحمەد

**1** زاروکێت زیرەك وەکی وێنەیێ نموونە وێنێ دیکە رەنگ بکەن و ئایا هنگ دزانن پەیاما ئەڤی وێنەی چییە؟





**2** هەڤالێت زیرەك ئەڤی وێنەی ب جوانی ڕەنگ بکەن



# فێربوینا زمانێ ئینگلیزی

ئا:حسێن حەسەن ئەحمەد
ژێدەر:سان رایس

## Listen and repeat. گوهێ خو بدەنێ پاشان ببێژنەڤە.

لووکینگ:تەماشا کرن looking تاکینگ: ئاخفتن talking ریدینگ: ڤەخویندن reading

درینکینگ:ڤەخواردن drinking ئیتینگ: خواردن eating رایتینگ: نڤیسین writing

## Listen and find. گوهێ خوو بدەیێ و ڤەبینەڤە.




## Listen and sing. گوهێ خوو بدەیێ و بسترە.



I'm reading a book . it's fun ,fun,fun

ئایم ریدینگئێ بووك .ئیتس فان . فان . فان

ئەزێ کتێبەکێ ڤەدخوینم .یا خووشە . خووشە . خووشە

I'm sitting in the sun ,sun,sun ,sun

ئایم سیتینگئین دێ سان . سان . سان

ئەزا ل بەر رۆژێ روینشتیمە . رۆژ . رۆژ. رۆژ

She's eating ice cream.it's fun ,fun

شیز ئیتینگئایس کریم.ئیتس فان . فان

ئەوکیژا ئایس کریمێ دخووتن . یاخووشە . خووشە

I'm with my friends.it's fun ,fun,fun

ئـــــایم ویس مای فرێندز.ئیتس فـــان . فـــان . فـــان

ئەس یێ دگەل هەڤالێت خوو .یا خووشە . خووشە . خووشە

# وێنەکێشان

ئا: حسێن حەسەن ئەحمەد

زاروکێت چاڤ گەش هنگ ژی وەکی مە وێنێ گۆلەکا جوان بکێشن:



# کاردەستی

ئامادە کرن :
حسێن حەسەن ئەحمەد

## بویکوك

هەڤالێت مە یێت قەدرگـــران پشتی کو هنگ فێر بوین کو ب هەڤیرێ کاردەستیان باش کـــار بکەن و تشتێت جـوان دروست بکەن نوکـە دەمێ هندێیە هنگ فێر ببن کو مفایێ ل فیقی( مێوە ) و شـیناتیان وەرگرن بو دروێست کـرنا کاردەستییێت جوان،هەروەتوڤ د کارن کووان بو خەملاندنا ژوورا خۆ ئانکو سفرا خوارنێ بکار بینن بو ڤێ ژمارێ دێ هنگو فێر کەین کـو ب باجان و تروزی و تەماتەو پەتاتە( کرتوپ ) و و کاغەزو دارکێت زراڤـ بویکوکەکا جوان و دلڤەکەر دروست یکەن .

بەلێ دڤێت هنگ دهایدار بن کــو جل و بەرگێت خـو بپارێزن ل پیس بوینێ و هـەر وەتوڤـ هنگ د ڤێت دهایدار بن ل ب کار ئینانا دارکێت زراڤ ل بەر دەستێ زاروکێت ساڤا نەهێل.

### کار دەستیا مە ب ڤی رەنگی ئامادە دبیت:

دڤیا هنگ بەرێ خو بدەنە لاپەڕا بەرامبەرو پاشی باجان و تروزی و تەماتەو پەتاتە( کرتوپ ) و کــاغەزو دارکێت زراڤـ ب وان جورو شێوەیان کــو هاتیە دیارکرن و ئامادە کرن،بەرهەڤ بکەن و ببرن پــاشی وان پارچە یێت ئامادەکری ل دویڤ شێوێ کاردەستیا مە کــو بو ڤێ جــارێ بویکوکە، لێك بـدەنەڤـە هەلبەت هنگدکارن کــو ڕەنگ و قـەبارا کـــاردەستیا خو ب دلـێ خـو هەلبژێرن بەرهەڤـ بکەن.



کاردەستیا مە یا بەرهەڤە.





هەڤالێت خوشتڤی وەکی مە گوتی ئەم دێ کەرەستەیێ خوب ڤی رەنگی ئامادە کەین و پاشی دێ لێکدەین هەروەتوڤە دێ پێوەستین بو دروست کرنا چاڤێت بوبکوکێ مفایێ ل کاغەزو رەنگێت مازێك ئانکو پێنوسێت رەنگی (دار) و ....هتد، وەرگرن.





# The First...



## کەی بۆ یەکەمجار ئاوێنە بە کار هێنرا؟

## THE FIRST MIRROR

ئایا رێکەوتووە,لە گۆماوێکی وەستاودا وێنەی ئاسمان و دارەکانت چاو پێ کەوتبێت؟لە ڕاستیدا ئەو چاوپێکەوتنە بریتییە لە سەیر کردن لە ئاوێنەدا ,ئاوێنە بریتییە لە رویەکی ساف و لوس کە وێنە و تیشك تیایدا ئاوەژو دەبێتەوە.

زور گرنگە روی ئاوێنە ساف و لوس بێت, بۆ نمونە ئەگەر بایەکی لە سەر خۆ بە سەر ئەو گۆمە ئاوەدا هەلبکات , ئەوا تیشکەکە ئاوەژو دەکاتەوە بەلام هیچ وێنەیەکی تێدا نا بینیت.لە کۆندا ئاوێنە لە کانزای زاخاو دراو دروستکراوە, ئاوێنەی تازەش لە پارچەیەك شوشەی زاخاودراو دروست دەکرێت بە لێدانی چینێك زیو لە پشتەکەی . بەلام شوشە بە تەنیا خۆی, ئاوێنە نییە و ئەو روەی کە تیشك و وێنەکان ئاوەژو دەکاتەوە زیوەکەیە, تەنیا ئیشی شوشەکەش پاراستنی زیوەکەیە لە کران و پیس بون.ناتوانین دەستنیشانی بکەین مرۆڤی کۆن کەی بیرۆکەی ئاوێنە دۆزیوەتەوە , بەلام دەبێت ئەویش هەروەك ئێمە سەیری گۆمە ئاوێکی کردبێت ووێنەی خوی تیادا بەدی کردبێت یان دەشێت بە رێکەوت تێبینی کرد بێت,کە روی کانزایەکی زاخاودراو وێنەکان ئاوەژو دەکاتەوە . یان دەشێت کانزایەکی‌بریبێت و بە چەندین شێواز زاخاوی دابێت بۆ ئەوەی ئاوێنەی لێدروست بکات. سەرەتای شارستانییەت لە یونان و میسر و رۆمای کۆن مرۆڤ وەك شتێکی بە سود ئاوێنەی قبولکرد ,تەنانەت خەلکی ئەو سەردەمە ئاوێنەی بچوکیان لە گەلّ خۆیان هەلدەگرت کە لە زێڕ و زیو و برۆنز دروست کرابوو. ئاوێنە لە کۆندا خەلکی ئەفسوناوی کردبوو,چونکە نەیاندەزانی چۆن ئیش دەکات بۆیە بروایان وابوو هێزێکی ئەفسوناوی تێدایە, گومانیشیان وابوو ئەو وێنەیەی کە تیایدا دەیبینن گیانیانە ,لە مەوە بوو پر و پوچی لە سەر شکاندنی ئاوێنە دروست بوو بروایان وابوو کە شکاندنی ئاوێنە ئازاری گیانیان دەدات. خەلکی شاری ڤینیسیا یەکەم کەسانێك بون فێربون ,چۆن ئاوێنە لە سەر شوشە دروستبکەن کە رویەکی بۆیاخکرابێت بە چینێك جیوە یان توتیا. نزیك سالی١٣٠٠(ز) خەلکی ئەم شارە دەستیان کرد بە دروستکردنی ئاوێنە بە رێژەیەکی زۆر کە لە ماوەیەکی کورتدا جێگەی ئاوێنەی کانزایی گرتەوە کە هەزاران سالّ بوو بە کار دەهێنرا.

ئـــا :حسینٚ حسن
ژێدەر :بانکی زانیاری

